# قنوت

## لە ڕوانگەی فەرموودە صەحیحەکانەوە


نوسینی

ئەحمەد ملا فایەق شارەزوری

عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ سَعْدِ بْنِ طَارِقٍ، قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي: يَا أَبَتِ إِنَّكَ قَدْ صَلَّيْتَ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَعَلِيّ هَاهُنَا بِالْكُوفَةِ، نَحْوًا مِنْ خَمْسِ سِنِينَ، «**فَكَانُوا "أَكَانُوا" يَقْنُتُونَ فِي الْفَجْرِ؟**» فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ مُحْدَثٌ، في رِوايَة: يَا بُنَيَّ إِنَّهَا بِدْعَةٌ.

رواه الترمذي (٤٠٢)، وابن ماجة (١٢٤١)، وأحمد (١٥٨٧٩)، النسائي (٦٧١).

**ناوی کتێب: قنوت لە ڕوانگەی فەرموودە صەحیحەکانەوە**

**نوسەر: أحمد ملا فائق سعید**

**چاپ:**

**چاپخانە: سیما / سلێمانی - عێراق**

**ساڵی چاپ: ١٤٣٦ ک - ٢٠١٥ ز**

**ژمارەی سپاردن:**

**بۆ لەچاپ دانەوەی:** ahmadmalafaiqsa3id@gmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل الله فلا هادي له. وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، وبعد.

**دروستبوونی ئادەمیزاد بۆ پەرستنەو بوونی مزگەوت و نوێژی جەماعەت هۆکاری کاملبوونی پەرستنەکانە.**

**هەندێك بابەت بەتایبەت پەیوەندی بە تەواوبوون و ڕاست و دروستی نوێژەوە هەیە هێشتا هەر بە ئاڵۆزی و ڕای جیاواز ماونەتەوە کە مایەی مشتومڕی بێ کۆتای ناو مزگەوتەکانە.**

**ئەمەش هۆکاری کەمتەرخەمی و بەدوادا نەچوونێکی دڵسۆزانەی زانستییە لەسەر بابەتەکە، کە هۆکاری مانەوەو یەکلا نەبوونەوەیەتی.**

**ئەم نوسینە هەوڵێکی گەرچی کەمیشە، بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەو تیشك خستنە سەر (قنوت)ە، بەتایبەت قنوتی بەیانیان، لە ڕوانگەی فەرموودەکان و ڕای زانایانەوە ، بۆ زیـاتر یەکـڕیز خستنی نوێژخوێنان**

لەسەر ڕاست و دروستی عیبادەتەکانیان، وە ڕەواندنەوەی نەزانین و ڕای جیاواز.

بەهیوای ڕازی بوونی خوای پەروەردگار ﷻ پاشان پێکانی حەق و سودمەندی موسوڵمانان.

وصلى الله وسلم وبارك على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه

أحمد ملا فائق سعيد

٢٥ / رمضان / ١٤٣٣ هـ

١٢ / ٨ / ٢٠١٢ م

# قنوت دوعایەکی کاتییە

قنوت بریتییە لە دوعایەکی بە کۆمەڵ و لەناو باشترین جۆرو کاتی دا کە عیبادەتی نوێژو کۆتاییەکەیەتی دانراوەو کراوە، ئەمانە هەموویان هۆکارێکی شەرعین بۆ زیاتر نزیك بوونەوە لە وەرگرتنی داواکاری و پاڕانەوەکان.

کاتێك ناخۆشییەك و ڕووداوێك ڕوو دەکاتە موسوڵمانان بۆ ماوەیەکی کاتی ئەم دوعایە دەکەن، وەکو هەموو ئەو دوعا تایبەتانەی ئادەمیزاد بۆ خۆی دەکات لەکاتی پێویستی دا تا پێویستییەکەی جێبەجێ دەبێت، هەرچەندە ئەمەو پێویستییەکان کاتییە، قنوتیش کە دوعای بەکۆمەڵە کاتییە.

وە بێگومانین لەوەی ئەسڵ لە نوێژدا (عیبادة)ە بەبێ دوعای قنوت بە بەڵگەی سەرتاپایی ئەو نوێژانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەمەنی دا کردوویەتی بەبێ قنوت بێجگە لەکاتی پێویست نەبێت.

هەروەك لەم ڕیوایەتانەی خوارەوەدا زۆر بە ڕوون و ئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت:

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ عَلَى أَحَدٍ أَوْ يَدْعُوَ لِأَحَدٍ، قَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ، فَرُبَّمَا

قَالَ: «إِذَا قَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الحَمْدُ...» [١].

**واتە:** پێغەمبەری خوا ﷺ گەر بیویستایە دوعا لە یەکێك بکات یاخود دوعای بۆ بکات قنوتی دەخوێند لە دوای ڕکوع کە دەیگوت: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ...).

٢- عَنْ أَنَس رضي الله عنه: «كانَ لا يَقْنُت إِلَا إِذَا دَعَا لِقَوْمٍ، أَوْ دَعَا عَلَى قَوْمٍ» [٢].

**واتە:** پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی نەدەخوێند لە نوێژدا بێجگە لە کاتێك کە دوعای لە کۆمەڵێك بکردایە یاخود بۆی بکردنایە.

٣- عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبْعِينَ رَجُلًا لِحَاجَةٍ، يُقَالُ لَهُمْ القُرَّاءُ، فَعَرَضَ لَهُمْ حَيَّانِ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ، رِعْلٌ، وَذَكْوَانُ، عِنْدَ بِئْرٍ يُقَالُ لَهَا بِئْرُ مَعُونَةَ،... فَقَتَلُوهُمْ «**فَدَعَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ شَهْرًا فِي صَلاَةِ الغَدَاةِ...**» [٣]، وفي رواية: «...فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَزِنَ

---

(١) رواه البخاري (٤٥٦٠).

(٢) سلسلة الأحاديث الصحيحة (٦٣٩).

(٣) رواه البخاري (٤٠٨٨).

حُزْنًا قَطُّ أَشَدَّ مِنْهُ»[1]، ومنه «قَنَتَ شَهْرًا يَدْعُو عَلَى حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ ثُمَّ تَرَكَهُ»[2].

**واته:** پێغەمبەری خوا ﷺ حەفتا قورئان خوێنی نارد بۆ شارەزاکردنی چەند هۆزێك بەڵام هۆزی (رعل و ذكوان لە بنەماڵەی بني سُلَيم) ڕێیان پێ گرتن لای بیری (معونة) و هەموویانیان شەهید کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ یەك مانگ قنوتی خوێند و دوعای لێکردن، نەمان بینی پێغەمبەری خوا ﷺ خەمبار بێت ئەوەندەی لەسەر ئەوان خەمبار بوو، پاشان دوعاکەی وازلێهێنا.

هۆکاری وازلێهێنانەکەی لەم فەرموودەیەدا ڕوون دەبێتەوە: قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: " ثُمَّ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَرَكَ الدُّعَاءَ بَعْدُ، فَقُلْتُ: أُرَى رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ تَرَكَ الدُّعَاءَ لَهُمْ، قَالَ: فَقِيلَ: وَمَا تُرَاهُمْ قَدْ قَدِمُوا ".[3]

**واته:** بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لە دوعاکە هێنا، پێیان

(١) رواه البخاري (١٣٠٠).

(٢) أخرجه النسائي (١٠٧٧ – ١٠٧٩) سنده صحيح.

(٣) رواه مسلم (٦٧٥).

ووتم: لەبەرئەوەی ئەو هۆزانە هاتن و موسوڵمان بوون.

قنوتی بەردەوام نییە، بەڵکو زۆر کاتی یە بە کاتی پێویستیەکان، تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەریش ﷺ و خەلیفەکان رضي الله عنهم و هاوەڵانیش رضي الله عنهم دا هەر بەو شێوەیە کاتی بووە، وەك لەم ڕیوایەتانەدا دەردەکەوێت:

٤- عَنْ عَلْقَمَةَ، وَالْأَسْوَدِ، قَالَا: «مَا قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي شَيْءٍ مِنَ الصَّلَوَاتِ إِلَّا إِذَا حَارَب»[١].

**واته:** پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی نەخوێندووە بێجگە لەکاتی شەڕەکان دا.

٥- عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ سَبْعِينَ رَجُلًا... فَقَتَلُوهُمْ «فَدَعَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ شَهْرًا فِي صَلاَةِ الغَدَاةِ، وَذَلِكَ بَدْءُ القُنُوتِ، وَمَا كُنَّا نَقْنُتُ»[٢].

**واته:** ئەنەس رضي الله عنه دەڵێت: دوای ئەوەی ئەو حەفتا قورئان خوێنەیان شەهید کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردبونی، مانگێك لە

(١) مصنف عبدالرزاق (١٣٧٠).

(٢) رواه البخاري (٤٠٨٨).

نوێژی بەیانی دا لە قنوت دا دوعای لێ دەکردن، ئەوە سەرەتای خوێندنی قنوت بوو، پێش ئەوە نەمان دەخوێند.

کەواتە تاوەکو ئەو ڕووداوە قنوت لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ نەکراوە، وە خوێندنی قنوتی ڕووداوەکەش مانگێك بەردەوام بووەو درێژەی نەبووە، ئەمە دان پیانانی ئەنەسی کوڕی مالیکە رضي الله عنه کە خاوەنی هەرەزۆری ڕیوایەتەکانی قنوتە.

٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: «قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهْرًا... يَدْعُو عَلَى أَحْيَاء... قَالَ عِكْرِمَة هذا مِفْتاح القنوت»[(١)].

عیکرمە یەکێکە لە گێڕەرەوەکانی (عبدالله ی کوڕی عەبباس)، بۆ ئەو بەسەرهاتەی پێشوو دەڵێت: ئەو ڕووداوە کلیل و سەرەتای قنوت کردن بوو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ.

٧- عَنْ عَلْقَمَةَ، وَالْأَسْوَدِ، قَالَا: «... لَا قَنَتَ عَلِيٌّ حَتَّى حَارَبَ أَهْلَ الشَّامِ، فَكَانَ يَقْنُتُ فِي الصَّلَوَاتِ كُلِّهِنَّ...»[(٢)].

**واتە:** علی کوڕی ئەبوطالب رضي الله عنه قنوتی نەدەخوێند بێجگە لەکاتی شەڕەکان دا نەبێت، ئەو کاتە لە هەموو نوێژەکان دا دەیخوێند.

---

(١) رواه أبوداود (١٤٤٣) سنده حسن، وفي الإرواء (٢/ ١٦٣).

(٢) مصنف عبدالرزاق (٤٩٦٧).

وە ئەبو إسحاق دەڵێت: ئەبو جەعفەر ووتی: عەلی کوڕی ئەبوطالب ﷺ قنوتی نەدەخوێند لای ئێمە تا گەیشتە لای ئێوە، واتە (کوفە)[١].

## جۆرەکانی قنوت

پاش ئەوەی زانیمان و سەلماندمان قنوت دوعایەکی کاتییە بۆ کاتی پێویست، پێویستە بزانین قنوت لە چەند بەش پێك هاتووە.

لای کۆی زانایان قنوت دوو جۆرە:

**یەکەم**: **قنوتی کاتی داباریـنی بەڵاکان** (**النازلة**):

ئەمە خۆی قنوتێکی گشتییە لە هەموو نوێژە فەرزەکان دا لە کۆتا ڕکات دا دوای ڕکوع و خوێندنی (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ئیمام دەیخوێنێت و نوێژخوێنانیش دەستی لەگەڵ دا هەڵدەبڕن و ئامین لەهەموو بەشەکانی دوعاکان دا تا کۆتایی دەکەن، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە گوێرەی بارودۆخی بەڵاکە لەڕووی قورسی و سوکی و پێویستییەوە بە گوێرەی عورفی ژیان، وە هیچ دوعاو داڕێژراوێکمان نییە (ئیمام) پەیوەست بێت بە خوێندنی، بەڵکو بە گوێرەی جۆری

(١) مصنف ابن أبي شيبة (٧٠٦٦).

بەڵاکە دوعا دادەڕێژرێت، وە گەر پەیوەست بێت بە هەندێك لە دوعا گشتییە گونجاوەکانی قورئان و فەرموودەوە باشترە لەگەڵ تێکەڵ کردنی ئەو دوعا تایبەتییەی کە دەیکات بۆ بەڵا دیاریکراوەکە.

**دووەم**: **قنوتی** (**الوتر**):

لە کۆتا ڕکاتی نوێژی وەتردا، نوێژخوێن ناوبەناو بەبێ بەردەوامی دوعاکەی حەسەنی کوڕی عەلی رضي الله عنهما دەخوێنێت.

## جۆری دوعای قنوتی داباریینی بەڵاو ناڕەحەتییەکان (قنوت النازلة)

دوعا لەکاتی قنوتی بەڵاکان دا ئیمام بۆی هەیە بەگوێرەی جۆرو بارودۆخی ڕووداوەکە دایبڕێژێت.

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: لَمَّا رَفَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأْسَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْجِ الوَلِيدَ بْنَ الوَلِيدِ، وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ، وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ، وَالْمُسْتَضْعَفِينَ بِمَكَّةَ، اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ، اللَّهُمَّ اجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي

يُوسُفَ»[١]، «...اللهُمَّ الْعَنْ لِحْيَانَ، وَرِعْلًا، وَذَكْوَانَ، وَعُصَيَّةَ عَصَتِ اللهَ وَرَسُولَهُ»[٢].

**واتە:** کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بیستی (ولید و سلمة و عیاش) موسوڵمان بوون لە مەککە بەند کرابوون، پاشان هەڵهاتن بگەنە (مدینة) لە نوێژی بەیانی دا لەدوای ڕکوع دوعای بۆ کردن بە سەلامەتی بگەن و ناوی بردن وە پاشان دوعای کرد لەو هۆزانەی هاوەڵانیان شەهید کردووەو ناوی هۆزەکانی دەبرد.

ئیمامی (النووي) رحمه الله دەڵێت: (وَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لَا يَتَعَيَّنُ فِيهِ دُعَاءٌ مَخْصُوص).[3]

**واتە:** ڕای دروست و ڕاست ئەوەیە کە دوعای تایبەت نییە بۆ قنوتی کاتی بەڵاکان.

وە عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه ئەم دوعایەی دەخوێند:

---

(١) رواه البخاري (٦٢٠٠).

(٢) رواه مسلم (٦٧٥).

(٣) شرح النووي على مسلم جـ٥ ص١٨١.

٢- عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: صَلَّيْتُ خَلْفَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ الصُّبْحَ فَقَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ قَالَ: فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْتَعِينُكَ، وَنَسْتَغْفِرُكَ، وَنُثْنِي عَلَيْكَ وَلَا نَكْفُرُكَ، وَنُؤْمِنُ بِكَ وَنَخْلَعُ وَنَتْرُكُ مَنْ يَفْجُرُكَ، اللَّهُمَّ إِيَّاكَ نَعْبُدُ، وَلَكَ نُصَلِّي وَنَسْجُدُ، وَإِلَيْكَ نَسْعَى وَنَحْفِدُ، وَنَرْجُو رَحْمَتَكَ وَنَخَافُ عَذَابَكَ إِنَّ عَذَابَكَ بِالْكَفَّارِينَ مُلْحَقٌ، اللَّهُمَّ عَذِّبِ الْكَفَرَةَ، وَأَلْقِ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ، وَخَالِفْ بَيْنِ كَلِمَتِهِمْ، وَأَنْزِلْ عَلَيْهِمْ رِجْزَكَ وَعَذَابَكَ، اللَّهُمَّ عَذِّبِ الْكَفَرَةَ أَهْلَ الْكِتَابِ الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ، وَيُكَذِّبُونَ رُسُلَكَ وَيُقَاتِلُونَ أَوْلِيَاءَكَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَأَصْلِحْ ذَاتَ بَيْنِهِمْ، وَأَلِّفْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ، وَاجْعَلْ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَالْحِكْمَةَ، وَثَبِّتْهُمْ عَلَى مِلَّةِ نَبِيِّكَ، وَأَوْزِعْهُمْ أَنْ يُوَفُّوا بِالْعَهْدِ الَّذِي عَاهَدْتَهُمْ عَلَيْهِ، وَانْصُرْهُمْ عَلَى عَدُوِّكَ وَعَدُوِّهِمْ، إِلَهَ الْحَقِّ، وَاجْعَلْنَا مِنْهُمْ»[١]،

---

(١) مصنف عبدالرزاق (٤٩٨٢)، مصنف ابن أبي شيبة (٧١٠٠)، البيهقي (٢/ ٢١٠)، وأصل صفة الصلاة للألباني (٣/ ٩٧٩).

وَرويَ عَنْ إِبنُ مَسْعُود أَنَهُ عَلَى النَاس القنوت قَريباً مِنْ هَذا[١].

**شێخ الألباني رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: ئەم ڕیوایەتانەی لە عومەری کوڕی خەتتاب دەگێڕدرێتەوە لەکاتی قنوتی بەڵاکان دا بووە[٢].**

## خوێندنی له نوێژه فەرزەکان دا

**قنوتی کاتی بەڵاکان (النازلة) بەبێ جیاوازی لەهەموو نوێژە فەرزەکان دا دەکرێت.**

١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَٱللَّهُعَنْهُمَا، قَالَ: " قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهْرًا مُتَتَابِعًا فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ وَصَلَاةِ الصُّبْحِ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ، إِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ، يَدْعُو عَلَى أَحْيَاءٍ...".[٣]

**واته: پێغەمبەری خوا ﷺ مانگێك قنوتی دەخوێند لە نیوەڕۆو**

(١) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٦٥).

(٢) الإرواء رقم (٤٢٨) صحيح. **هەروەك دەگێڕدرێتەوە لە** مصنف عبدالرزاق (٤٩٩٢)، وابن أبي شيبة (٧١٠٥).

(٣) رواه أبوداود (١٤٤٣)، ابن خزيمة (٦١٨) وهو حديث حسن.

عەسرو مەغریب و عیشاو بەیانی دا، دوعای لەو هۆزانە دەکرد کە هاوەڵانیان شەهید کرد.

٢- حَدَّثَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: وَاللهِ لَأُقَرِّبَنَّ لَكُمْ صَلَاةَ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ «يَقْنُتُ فِي الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ مِنْ صَلَاةِ الظُّهْرِ، وَصَلَاةِ الْعِشَاءِ الْآخِرَةِ، وَصَلَاةِ الصُّبْحِ، فَيَدْعُو لِلْمُؤْمِنِينَ، وَيَلْعَنُ الْكَافِرِينَ»[(١)].

**واتە:** ئەبو هورەیرە رضي الله عنه ووتی: سوێند بە خوا وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکانتان بۆ دەکەم پاشان قنوتی لە نیوەڕۆو عیشاو بەیانی دا کردو دوعای بۆ ئیمانداران دەکردو نەفرەتی لە بێ بڕوایان دەکرد.

## خوێندنی دوعای قنوت پاش ڕکوع

شوێنی قنوتی (نوازل) پاش ڕکوع بردنە و دوای ووتنی (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، لەسەر گێڕانەوەی سێ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ:

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: «لَمَّا رَفَعَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأْسَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ...»[(٢)].

---

(١) رواه البخاري (٧٩٧)، ومسلم (٦٧٦).

(٢) رواه البخاري (٦٢٠٠).

٢- وفي رِوايَة عَنهُ: «أَنَّ رَسُولَ اللهَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْعُوَ عَلَى أَحَدٍ أَوْ يَدْعُوَ لِأَحَدٍ، قَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ»[١].

**واتە:** ئەبو هورەیرە لەم دوو ڕیوایەتەدا دەڵێت پاش ڕکوع پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی خوێندووە.

٣- **پرسیار لە ئەنەسی کوڕی مالك کرا:** هَلْ قَنَتَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ؟قَالَ:نَعَمْ، بَعْدَ الرُّكُوعِ يَسِيرًا
[٢].

**واتە:** ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی لە نوێژی بەیانی دا خوێندووە؟ ووتی بەڵێ پاش ڕکوع بە ماوەیەکی کەم.

**وە ئەنەس** رضي الله عنه **دەڵێت:** «أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَنَتَ شَهْرًا بَعْدَ الرُّكُوعِ...»[٣].

**واتە:** **پێغەمبەری خوا ﷺ مانگێك قنوتی خوێند پاش ڕکوع.**

---

(١) رواه البخاري (٤٥٦٠).

(٢) رواه مسلم (١٥٥٤).

(٣) رواه مسلم (١٥٤٦).

٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: " قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهْرًا مُتَتَابِعًا... إِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ...".(١)

**واته: عبدالله ی کوڕی عەبباس دەڵێت: مانگێك پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی خوێند پاش وتنی (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) لە ڕکاتی کۆتایی دا.**

٥- عَنِ الْعَوَّامِ بْنِ حَمْزَةَ، قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا عُثْمَانَ عَنْ الْقُنُوتِ، فَقَالَ: «بَعْدَ الرُّكُوعِ»، فَقُلْتُ: عَمَّنْ؟ فَقَالَ: «عَنْ أَبِي بَكْرٍ وعمر، وَعُثْمَانَ»(٢).

**بەڵام چەند ڕیوایەتێکی تر هاتووە لە (مصنف ابن أبي شيبة) بە ژمارە (٧٠٩١، ٧٠٩٢، ٧٠٩٤) کە عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه قنوتی پێش ڕکوع خوێندووە (قنوت النازلة) لە نوێژی بەیانی دا.**

**شێخ الألباني لە الإرواء جـ٢ ص١٦٥ دا دەڵێت:** من طرق أخرى عن عمر أنه قنت في الفجر قبل الركوع، وبعضها صحيح الإسناد.

(١) رواه أبوداود (١٤٤٤) سنده صحيح.

(٢) مصنف ابن أبي شيبة (٧٠٨٥)، قال الألباني: إسناده حسن.الإرواء جـ٢ص١٦٤.

وروى ابن أبي شيبة مثله بإسنادين عن ابن عباس، وكلاهما صحيح.

فتبين مما سبق أن عمر رضي الله عنه ثبت عنه كل من القنوت قبل الركوع وبعد الركوع.

**قلت:** قد ثبت القنوت قبل الركوع عن عمر من عدة طرق صحيحة فالصواب القول بثبوت الأمرين عنه[1].

في مصنف عبدالرزاق قبل الركوع رقم (٤٩٧٣)، وبعد الركوع برقم (٤٩٨٢)، و مصنف إبن أبي شيبة (٧٠٩١، ٧٠٩٤، ٧٠٨٦، ٧١٠٦، ٧١١٤).

**چەند ڕیوایەتێکمان لە عومەری کوڕی خەتتابەوە رضي الله عنه هەیە پێش ڕکوع قنوتی خوێندووە و هەندێکی (صحیح)ە، بەمە ڕوون بووەوە کە هەردوو جۆرەکە (پێش ڕکوع و دوای ڕکوع) قنوتی خوێندووە.**

عن حميد عن قتادة قال: " كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يقنت بعد الركعة، وأبو بكر وعمر، حتى كان عثمان، قنت قبل

(١) إرواء الغليل جـ٢ ص١٧١.

الركعة ليدرك الناس ".

قال الألباني: أخرجه ابن نصر فى " قيام الليل " (١٣٣) بإسناد صحيح، وأخرجه عبدالرزاق في مصنفه برقم (١٣٧٢، ٤٩٧٦).

**واتە:** پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی دوای ڕکوع خوێندووە، وە هەروەها ئەبوبەکرو عومەر تا سەردەمی عوسمان پێش ڕکوع خوێندوویانە بۆ ئەوەی خەڵك بگات بە نوێژی جەماعەت. کەواتە عوسمانیش رضي الله عنه پێش ڕکوع خوێندوویەتی.

**بەڵام ئەم ڕیوایەتە:**

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، قَالَ: سُئِلَ عَنِ الْقُنُوتِ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ، فَقَالَ: «**كُنَّا نَقْنُتُ قَبْلَ الرُّكُوعِ وَبَعْدَهُ**»[١].

**واتە:** بەهەمان شێوە پرسیار لە قنوتی بەیانیان کرا لە ئەنەس، ووتی: ئێمە پێش ڕکوع و پاش ڕکوع قنوتمان دەخوێند.

وشەی (قبل الرکوع) شێخ ئەلبانی دەڵێت: (شاذ)ە، واتە ئیشی پێ ناکرێت لەبەرئەوەی لە ڕیوایەتەکانی تردا نەهاتووە، وە پاشان لەهەمان ڕێگەوە هاتووە بەبێ ناوبردنی نوێژی بەیانی بەهەمان ڕاوی کە (حميد)ە

---

(١) حديث صحيح، ابن ماجة (١١٨٣). ولفظ «قَبْلَ الرُّكُوعِ» شاذ، الإرواء (٢/ ١٦١).

پرسیار دەکرێت لـە ئەنەس: «سئل أنس بن مالك عن القنوت قبل الركوع أم بعده؟ قال: كل ذلك كنا نفعل»[١].

**واتە:** قنوت پێش ڕکوعە یاخود دوای ڕکوع؟ ئەنەس ووتی: هەموویمان دەکرد، بەو مانایەی (وەتر) پێش ڕکوعەو (النازلة) دوای ڕکوعە، هەردوو جۆرە قنوتەکەمان کردووە.

بێگومان بەپێی گێڕانەوەکانی (أبو هريرة، أنس، ابن عباس) ﭫ وەکو سوننەت پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ڕکوع خوێندویەتی، ئەمە مایەی پابەند بوون و دەرنەچوونی تەواوە بەو سوننەتەوە، گەرچی (صحابة) وەکو (إجتهاد) بەو شێوەیە کردوویانە.

وقال الحافظ: وَمَجْمُوعُ مَا جَاءَ عَنْ أَنَسٍ مِنْ ذَلِكَ أَنَّ الْقُنُوتَ لِلْحَاجَةِ بَعْدَ الرُّكُوعِ لَا خِلَافَ عَنْهُ فِي ذَلِك[٢].

ابن حجر 﫼 دەڵێت: بەکۆی گشتی ڕیوایەتەکانی ئەنەس قنوتی کاتی پێویست دوای ڕکوعەو خیلافی تێدا نییە.

---

(١) رواه السراج في مسنده (١/ ١١٦)، الإرواء جـ٢ ص١٦٢،١٦١.

(٢) فتح الباري (٢/ ٥٦٩).

# دەست هەڵبڕین و ئامین کردن

پێویستە بۆ خوێندنی قنوت ئیمام و نوێژخوێنان دەست هەڵبڕن:

**١- «إذا سألتم الله تعالى فاسألوه ببطون أكفكم ولا تسألوه بظهورها»**[1].

**واتە:** پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێت: گەر دوعاتان کرد بەناو لەپی دەستەکانتان بیکەن، بەپشتی دەست مەیکەن.

٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ فِي قِصَّةِ الْقُرَّاءِ وَقَتْلِهِمْ قَالَ: فَقَالَ لِي أَنَسٌ: لَقَدْ " رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كُلَّمَا صَلَّى الْغَدَاةَ رَفَعَ يَدَيْهِ يَدْعُو عَلَيْهِمْ ".[2]

**واتە:** دەمبینی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو نوێژێکی بەیانی هەردوو دەستی هەڵدەبڕی و دوعای دەکرد.

هەروەك لەم ڕیوایەتانەی خوارەوە هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی تا ئاستی سەرشانی یاخود دەم و چاوی هەڵدەبڕی،

---

(١) صحيح الجامع الصغير للألباني (٥٩٣، ٣٦٣٤).

(٢) صحيح، أحمد (١٢٤٠٢)، البيهقي في سنن الكبرى (٣١٤٥)، أنظر الإرواء جـ٢ ص١٨١، أصل صفة الصلاة للألباني (٣/ ٩٥٧) سنده صحيح.

هەردوو ناو لەپی دەستی ڕووی لە دەم و چاوی بووە لە ئاستی سەری بەرزتر نەبووە.

٣- وفي صلاة الإستسقاء: عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ، أَنَّهُ «رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الِاسْتِسْقَاءِ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، وَقَلَبَ الرِّدَاءَ، وَرَفَعَ يَدَيْهِ»[1].

٤- «...فَرَفَعَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَدَيْهِ حِذَاءَ وَجْهِهِ...»[2]، وفي رواية: «رَافِعًا يَدَيْهِ قِبَلَ وَجْهِهِ، لَا يُجَاوِزُ بِهِمَا رَأْسَهُ»[3].

٥- «كَانَ إِذا دَعَا جَعَلَ بَاطِن كَفِّهِ إِلَى وَجْهِهِ»[4].

٦- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، قَالَ: «كَانَ عُمَرُ يَقْنُتُ بِنَا بَعْدَ الرُّكُوعِ، وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُوَ ضَبْعَاهُ، وَيُسْمَعَ صَوْتُهُ مِنْ وَرَاءِ الْمَسْجِدِ»، وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، «...فَرَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى مَدَّ ضَبْعَيْهِ»[5]، وَعَنْ

---

(١) رواه النسائي (١٥١٢) سنده صحيح.

(٢) رواه النسائي (١٥١٥) سنده حسن صحيح.

(٣) رواه أبو داود (١١٦٨) سنده صحيح.

(٤) صحيح الجامع الصغير (٤٧٢١).

(٥) مصنف ابن أبي شيبة (٧١١٤، ٧٠٤٣).

إِبْرَاهِيمَ النَخَعي، قَالَ: «ارْفَعْ يَدَيْكَ لِلْقُنُوتِ»[١].

وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: «الْمَسْأَلَةُ أَنْ تَرْفَعَ يَدَيْكَ حَذْوَ مَنْكِبَيْكَ...»[٢].

**واته:** داواکردن دەبێت هەردوو دەست بەرز بکرێتەوە تا ئاستی سەرشان و ئەو نزیکانە.

٧- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، «أَنَّ عُمَرَ، رَفَعَ يَدَيْهِ فِي قُنُوتِ الْفَجْرِ»[٣]، وَعَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: " صَلَّيْتُ خَلْفَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فَقَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ وَرَفَعَ يَدَيْهِ وَجَهَرَ بِالدُّعَاءِ ".[٤]

**واته:** عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه قنوتی دەخوێند لەدوای ڕکوع و هەردوو دەستی بەرز دەکردەوەو بە دەنگی بەرز دوعای دەکرد.

٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: " قَنَتَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة (٧٠٢٦).

(٢) رواه أبو داود (١٤٨٩) سنده صحيح.

(٣) مصنف ابن أبي شيبة (٧١١٥)، والبيهقي في الكبرى (٣١٤٧).

(٤) السنن الكبرى للبيهقي (٣١٥٠).

وَسَلَّمَ شَهْرًا ... وَيُؤَمِّنُ مَنْ خَلْفَهُ ".[١]

**واتە:** **مانگێك پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی دەخوێند و نوێژخوێنانیش (ئامین) یان دەکرد.**

٩- «... **وَكَانَ يَجْهَرُ بِدُعَائِهِ**»[٢].

**واتە:** **پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی هەڵدەبڕی لەکاتی خوێندنی قنوت دا.**

١٠- عَنْ أَبِي رَافِعٍ قَالَ: " صَلَّيْتُ خَلْفَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فَقَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ وَرَفَعَ يَدَيْهِ وَجَهَرَ بِالدُّعَاءِ ".[٣]

١١- وكان أبو هريرة يرفع يديه في قنوته في شهر رمضان[٤].

---

(١) رواه أبوداود (١٤٤٣) سنده حسن.

(٢) رواه البخاري (٤٥٦٠).

(٣) السنن الكبرى للبيهقي (٣١٥٠).

(٤) ابن نصر في قيام الليل ص١٣٨.

# قنوتی وه‌تر (پێش ڕكوع)

سوننه‌ته خوێندنی قنوت له نوێژی وه‌تردا ناوبه‌ناو به درێژایی ساڵ[(١)].

١- عَنْ الحَسَنُ بْنُ عَلِيّ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللهَّ صَلَّى اللهُّ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الوِتْرِ: «اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، وَلَا يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ، لَا مَلْجَأَ مَنْجَأَ مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ»[(٢)].

---

(١) ناوبه‌ناو ده‌خوێنرێت ته‌نانه‌ت له نیوه‌ی كۆتایی ڕه‌مه‌زانیش دا، له‌به‌ر ئه‌وه ڕیوایه‌ته‌كه‌ی (عائیشة و ابن عباس) باس له قنوت ناكه‌ن كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ خوێندبێتی وه گه‌ر بیخوێندایه شاراوه نه‌ده‌بوو لای هاوه‌ڵان و باسیان ده‌كرد، به‌ڵام ڕێگه‌ی (جمع) كۆی نێوان ئه‌و ڕیوایه‌تانه‌و ڕیوایه‌ته‌كه‌ی (أُبي) ئه‌وه‌یه ناوبه‌ناو ده‌یكرد، وه له‌لایه‌كی تریشه‌وه سوننه‌ته لای كۆی زانایان و (صه‌حابه‌و تابعین).بڕوانه: أصل صفة الصلاة جـ٣ ص٩٧٠.

(٢) رواه أبوداود (١٤٢٥)، والترمذي (٤٦٤)، وابن ماجة (١١٧٨)، وابن خزيمة (١٠٩٥) سنده صحيح، صفة صلاة النبي للألباني ص٥٧.

کاتی خوێندنەکەی ڕوون دەکاتەوە، لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: «علمني رسول الله صلى الله عليه وسلم أن أقول إذا فرغت من قراءتي في الوتر: اللهم اهدني فيمن هديت ...»[(١)].

**واته:** پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردم کاتێك لە خوێندنی قورئان لێبوومەوە لە وەتردا بڵێم: (اللهم اهدني فيمن هديت ...)، شێخ ئەلبانی رحمه الله دەڵێت: (ظاهر قبل الركوع) ئاشکرایە پێش ڕکوع.

بەڵام ئەم زیادەیە: (سبحانك...) و (فلك الحمد على ما قضيت، أستغفرك وأتوب إليك). هیچ پەیوەندی بە فەرموودەی پێشووەوە نییە و لێیان زیاد کردووە[(٢)].

٢- حَدَّثَنَا عَاصِمٌ الأَحْوَلُ، قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ القُنُوتِ فِي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَقُلْتُ: كَانَ قَبْلَ الرُّكُوعِ أَوْ بَعْدَهُ؟ قَالَ: قَبْلَهُ، قُلْتُ: فَإِنَّ فُلاَنًا أَخْبَرَنِي عَنْكَ أَنَّكَ

(١) أخرجه ابن منده في "التوحيد" بسند حسن، أصل صفة الصلاة جـ٣ ص٩٧٣، الإرواء جـ٢ ص١٦٨.

(٢) القول المبين: ١٣٤، وأصل صفة الصلاة جـ٣ ص٩٧٦.

قُلْتَ بَعْدَهُ، قَالَ: كَذَبَ «إِنَّمَا قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدَ الرُّكُوعِ شَهْرًا أَنَّهُ كَانَ بَعَثَ نَاسًا يُقَالُ لَهُمْ الْقُرَّاءُ...»[1].

**واتە:** (عاصم) دەڵێت پرسیارم لە (ئەنەس) کرد لە قنوت لە نوێژدا وتم: پێش ڕکوع یاخود دوای ڕکوع؟ ووتی پێش ڕکوع، ووتم: فلاَن کەس هەواڵی دامێ لە تۆوە کە ووتوتە دوای ڕکوع، ووتی: هەڵەی کردووە، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی دوای ڕکوع خوێندووە مانگێك کە کۆمەڵێك لە هاوەڵان شەهید کران... .

ئەنەس دژایەتی ئەوە دەکات کە قنوت دوای ڕکوع بێت بێجگە لەو ڕووداوە نەبێت (قنوت النازلة)، بەمە تێدەگەین کە قنوتی وەتر پێش ڕکوعە، هەروەك چۆن خۆی دەڵێت ئەمە سەرەتای قنوت کردن بوو.

وە بێگومان ئەوەی دوای ووردەکارییەکانی گێڕانەوەی ئەنەس بکەوێت بەکۆی گێڕانەوەکانی بێگومان دەبێت لەوەی قنوتی وەتر پێش (ڕکوع)ە.

٣- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، «كَانَ يُوتِرُ فَيَقْنُتُ قَبْلَ

(١) رواه البخاري (١٠٠٢).

الرُّكُوعِ»[١].

**واتە:** پێغەمبەری خوا ﷺ کە وەتری دەکرد قنوتی پێش ڕکوع دەخوێند.

٤- عَن ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: كَانَ صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمْ يَقْنُتُ فِي رِكْعَة الوَتِرِ[٢].

٥- عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، «أَنَّ ابْنَ عُمَرَ قَنَتَ فِي الْوَتْرِ قَبْلَ الرُّكُوعِ»[٣].

**واتە:** عبداللە ی کوڕی عومەر قنوتی پێش ڕکوع خوێندووە لە وەتردا.

**٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: «كَانَ ابْنُ مَسْعُودٍ لَا يَقْنُتُ فِي شَيْءٍ مِنَ الصَّلَوَاتِ، إِلَّا فِي الْوَتْرِ قَبْلَ الرُّكُوعِ»[٤].**

---

(١) رواه أبوداود (١٤٢٧)، وابن ماجة (١١٨٢)، سنده صحيح، الإرواء (٤٢٥).

(٢) مصنف عبدالرزاق (١٣٨٠)، والدارقطني (١٦٤٧)، البيهقي في الكبرى (٣/ ٤١)، وابن نصر، والدارقطني بسند صحيح، أنظر صفة الصلاة ص١٤٢.

(٣) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٠٠).

(٤) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٠٤)، قال الألباني في الإرواء جـ٢ ص١٦٦: سنده صحيح.

**واتە:** عبداللّٰه ی كوڕی مەسعود لە هیچ نوێژێك دا قنوتی نەدەخوێند بێجگە لە وەتر نەبێت پێش ڕكوع.

٧- عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنِ الْأَشْعَثِ، عَنِ الْحَكَمِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: «الْقُنُوتُ فِي الْوِتْرِ مِنَ السَّنَةِ كُلِّهَا قَبْلَ الرَّكْعَةِ»(١).

**واتە:** ئیبراهیمی نەخەعی دەڵێت: قنوتی وەتر لە هەموو ساڵەكەدا دەكرێت پێش ڕكوع.

٨- عَنْ هِشَامٍ، أَنَّ الْحَسَنَ، وَابْنَ سِيرِينَ كَانَا «يَقْنُتَانِ فِي الْوِتْرِ قَبْلَ الرَّكْعَةِ»(٢).

**واتە:** حەسەنی بەصری و محمدی كوڕی سیرین قنوتی وەتریان پێش ڕكوع دەكرد.

٩- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْأَسْوَدِ، عَنْ أَبِيهِ، «أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ، كَانَ يُوتِرُ فَيَقْنُتُ قَبْلَ الرُّكُوعِ»(٣).

**واتە:** عبداللّٰه ی كوڕی مەسعود قنوتی وەتری پێش ڕكوع دەكرد.

---

(١) مصنف عبدالرزاق (٤٩٩٣).

(٢) مصنف عبدالرزاق (٤٩٩٤).

(٣) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٠٣).

١٠- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، «أَنَّهُ كَانَ يَقْنُتُ فِي الْوَتْرِ قَبْلَ الرُّكُوعِ»[1].

**واته:** سەعیدی کوڕی جوبەیری تابیعی قنوتی وەتری پێش ڕکوع دەخوێند.

١١- عَنْ عَلْقَمَةَ، «أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ، وَأَصْحَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، كَانُوا يَقْنُتُونَ فِي الْوَتْرِ قَبْلَ الرُّكُوعِ»[2].

**واته:** عبدالله ی کوڕی مەسعودو هاوەڵان قنوتیان پێش ڕکوع دەخوێند.

وقال الألباني رحمه الله: (والخلاصة أن الصحيح الثابت عن الصحابة هو القنوت قبل الركوع في الوتر)[3].

**واته:** کورتەی باسەکە ئەوەیە ئەوەی ڕاست و دروستە لە هاوەڵانەوە قنوتی وەتر پێش ڕکوعە.

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩١٠).

(٢) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩١١)، قال الألباني في الإرواء ج٢ ص١٦٦: سنده حسن، أصل صفة الصلاة جـ٣ ص٩٧١.

(٣) إرواء الغليل جـ٢ ص١٦٦.

وقال ابن حجر رَحِمَهُ اللَّهُ: (...وَأَمَّا لِغَيْرِ الْحَاجَةِ فَالصَّحِيحُ عَنْهُ أَنَّهُ قَبْلَ الرُّكُوعِ...)[١].

**واتە:** بێجگە لە کاتی بەلا، پێش ڕکوعە بەگوێرەی ڕیوایەتەکان.

١٢- عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الْحَسَنِ، «أَنَّ أُبَيًّا أَمَّ النَّاسَ فِي خِلَافَةِ عُمَرَ فَصَلَّى بِهِمِ النِّصْفَ مِنْ رَمَضَانَ، لَا يَقْنُتُ فَلَمَّا مَضَى النِّصْفُ، قَنَتَ بَعْدَ الرُّكُوعِ...»[٢].

**واتە:** ئوبەی کوڕی کەعب پێشنوێژی تەراویحی بۆ خەڵك دەکرد لە سەردەمی عومەر دا لە نیوەی یەکەم دا قنوتی نەدەخوێند، لە نیوەی دووەم دا دەیخوێند دوای ڕکوع.

١٣- رِواية عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ عَبْدٍ الْقَارِيَّ: «وَكَانَ فِي عَهْدِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ... خَرَجَ لَيْلَةً فِي رَمَضَانَ... وَكَانُوا يَلْعَنُونَ الْكَفَرَةَ فِي النِّصْفِ: اللَّهُمَّ قَاتِلِ الْكَفَرَةَ الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ... ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَيَدْعُو لِلْمُسْلِمِينَ بِمَا

---

(١) فتح الباري (٢/ ٥٦٩).

(٢) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٣٥)، ابن خزيمة في صحيحه (١٠٩٧).

اسْتَطَاعَ مِنْ خَيْرٍ... ثُمَّ يُكَبِّرُ وَيَهْوِي سَاجِدًا»[١].

**واته:** لەدوای نیوەی ڕەمەزان قنوتیان دەخوێندو دوعایان بۆ باوەڕداران دەکرد وە سلاَواتیان دەداو پاشان دەچوون بە سوجدەدا.

دروستە لە ڕەمەزان دا بەم شێوەیە دوای (ڕکوع) قنوتی وەتر بخوێندرێت وە دوعای گشتی بکرێت بەو دوو ڕیوایەتە کە کاری (صحابة)یە لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه دا بە ڕازی بوونی کۆی گشتی (صحابة)[٢].

بەلاَم بناغەی کارەکە خوێندنیەتی پێش ڕکوع، پێویستە ئەمە بپارێزرێت، بەو هەموو کارو گێڕانەوانەی (صەحابە و تابعين) گەیاندوویانە.

١٤- عَنِ الْحَسَنِ، أَنَّ عُمَرَ، حَيْثُ «أَمَرَ أُبَيًّا أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ فِي رَمَضَانَ، وَأَمَرَهُ أَنْ يَقْنُتَ بِهِمْ فِي النِّصْفِ الْبَاقِي، لَيْلَةَ سِتَّ عَشْرَةَ»[٣].

**واته:** عومەری کـــوڕی خەتتاب رضي الله عنه فەرمانی دا بە ئوبەی کوڕی

---

(١) صحيح ابن خزيمة (١١٠٠)، قال الألباني: إسناده صحيح.

(٢) قيام رمضان للألباني ص٢١.

(٣) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٤١).

کەعب لەنیوەی ڕەمەزان بەدواوە قنوتیان بۆ بخوێنێت.

١٥- عَنْ عَلِيّ، «أَنَّهُ كَانَ يَقْنُتُ فِي النِّصْفِ مِنْ رَمَضَانَ»[(١)].

**واتە:** عەلی کوڕی ئەبو تالیب و عبداللە ی کوڕی عومەر ﵄ قنوتیان لە نیوەی ڕەمەزان بەدواوە دەخوێند.

## سڵاوات و دەست هێنان بە دەم و چاودا پاش قنوت

سڵاوات هۆکاری وەرگرتنی دوعاکانە، وەکو لە ووتەی هاوەڵان دا هاتووە، وە بڕوانینە سوننەتەکان وەکو خوێندنی لە نوێژی مردوودا کە پێش دوعاکردنە بۆ مردووەکە، یاخود خوێندنی لە کۆتایی تەحییات دا پێش دوعا کردنەکان پێغەمبەری خوا ﷺ دایناوە بۆ هۆکاری وەرگرتنی عیبادەت و داواکان، پێدەچێت ئەمانە هۆکارێك بوبێتن بۆ خوێندنی سڵاوات لەدوای قنوتی وەتر لە ڕەمەزان دا لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ وەکو (إجتهاد)ی خەلیفەو هاوەڵان لە (عبادات) دا پێویستە پەیوەست بین و بوەستین لە ئاست سنوری ئایەت و فەرموودە دا، بۆیە سڵاوات لەدوای قنوت لە

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٣٤).، وكذلك عن ابن عمر ﵄ رقم (٦٩٣٢).

فەرموودەیەك دا هاتووە كە (سند) ڕێگەکەی (ضعیف)ە[(١)] لە سەردەمی خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه لە نیوەی کۆتایی ڕەمەزان دا لە وەتر دا دوای قنوت سلاواتیان خوێندووە، گەرچی ئەمە لە وەتردا بووە بەلام وەکو بەکارهێنانی خەڵکی لەهەموو جۆرە قنوتێك دا خوێندراوە.

هەر بۆیە ابن القیم رحمه الله دەڵێت: (نقل من قنوت الوتر إلى قنوت الفجر قياساً)[(٢)].

**واتە:** لە قنوتی وەترەوە گواستراوەتەوە بۆ قنوتی بەیانیان واتە (نازلة)، گەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قنوتی (النازلة)دا نەیخوێندووە، وە لە وەتریش دا باسی نەهاتووە کە فێری حەسەنی کوڕی عەلی رضي الله عنهما کردبێت، وەکو شێخ العثیمین رحمه الله دەفەرموێت: (إن الصلاة على النبِي صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أمر محبوب وينبغي أن يقرن بها كل دعاء، لكن كوننا نجعلها من سنن القنوت، هذا محل نظر)[(٣)].

**واتە:** پێویستە سلاوات پەیوەست بێت بە هەموو دوعاکانەوە بەلام

---

(١) سنن النسائي (١٧٤٦) سنده ضعيف، أصل صفة الصلاة جـ٣ ص٩٧٦.

(٢) جلاء الأفهام ص٥١٣.

(٣) مجموع فتاوى ورسائل العثيمين جـ١٤ ص١٤١.

گەر بە سوننەتێکی قنوتی دابنێین ئەمە شوێنی سەرنجە.

١- عن علي مرفوعا: " كل دعاء محجوب حتى يصلى على النبي صلى الله عليه وسلم ".[١]

**واتە:** هیچ دوعایەك وەرناگیرێت هەتا سڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ نەدەیت.

٢- عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ، قَالَ: إِنَّ الدُّعَاءَ مَوْقُوفٌ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لاَ يَصْعَدُ مِنْهُ شَيْءٌ، حَتَّى تُصَلِّيَ عَلَى نَبِيِّكَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ[٢].

**واتە:** عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەفەرموێت: دوعا لەنێوان ئاسمان و زەوی دا ڕادەوەستێت تاوەکو سڵاوات نەدەیت لەسەر پێغەمبەرەکەت ﷺ.

٣- وە ئیمامی عومەر ﵁ لەسەردەمی خۆی دا کە قنوت خوێندراوە سڵاواتیان داوە لەدوای قنوت[٣].

---

(١) سلسلة الأحاديث الصحيحة (٢٠٣٥).

(٢) رواه الترمذي (٤٨٦) سنده حسن، ورواية عن علي ﵁ في صحيح الجامع (٧٠٨٢).

(٣) ابن خزيمة (١١٠٠)، فضل الصلاة على النبي ﷺ لإسماعيل القاضي (١٠٧) بتحقيق الألباني اسناده صحيح، وابن نصر في القيام ص١٣٦، وجلاء الأفهام رقم (٣٧١).

٤- عن ابن مسعود رضي الله عنه: «**إذا أراد أحدكم أن يسأل فليبدأ بالمدحة والثناء على الله بما هو أهله، ثم ليصل على النبي ﷺ، ثم ليسأل بعد فإنه أجدر أن ينجح**»[1].

**واته:** گەر کەسێکتان ویستی دوعا بکات، سەرەتا وەصف و سوپاس و ستایشی پەروەردگار بکات بەو شێوەیەی شایستەیەتی (واته بە خوێندنی چەند ناوو سیفاتێکی خوای پەروەردگار کە پەیوەندی بە دوعاکەیەوە هەیە)، پاشان سڵاوات بدات پاش ئەوە داوا بکات، ئەوە لەپێشترە هۆکاری وەرگیراو بێت دوعاکەی.

٥- عن قتادة عن عبد الله بن الحارث: أن أبا حليمة معاذ كان يصلي على النبي صلى الله عليه وسلم في القنوت[2].

**واته:** مەعاز رضي الله عنه سڵاواتی لە پێغەمبەر ﷺ دەدا لە قنوت دا.

٦- دەست هێنان بە دەم و چاو دا لەدوای دوعاکردن یاخود قنوت، هەموو ئەو فەرموودانەی لەو بارەیەوە هاتوون (ضعیف)ن و کاریان پێ ناکرێت، بەدەر لەوەی لەو هەموو فەرموودە

---

(١) سلسلة الأحاديث الصحيحة (٣٢٠٤).

(٢) فضل الصلاة على النبي ﷺ بتحقيق الألباني ص٨٧ رقم (١٠٧) سنده صحيح.

(صحيح)انەی پێشتر باس کرا لە قنوت و دوعا کردن دا، هيچ باسی دەستهێنانی بە دەم و چاودا نەکردووە و تیایدا نییە.

٧- رِوايَة عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «إِذَا دَعَوْتَ اللَّهَ فَادْعُ بِبَاطِنِ كَفَّيْكَ، وَلَا تَدْعُ بِظُهُورِهِمَا، فَإِذَا فَرَغْتَ فَامْسَحْ بِهِمَا وَجْهَكَ».ضعيف[١].

پرسيار لە (إمام أحمد) کرا لە دەستهێنان بە دەم و چاودا لەدوای قنوت، فەرمووی (لم أسمع فيه شيأً) هيچم لەبارەيەوە نەبيستووە[٢].

بەهەمان شێوە لە (إمام مالك و عبدالله بن مبارك و سفيان الثوري) پرسيار کرا، ئەوانيش ڕەديان دەدايەوەو دژايەتی يان دەکرد، وە (إمام البيهقي) لە (السنن)ەکەی دا دەڵێت: (**فأما مسح اليدين بالوجه عند الفراغ من الدعاء فلست أحفظه عن أحد من السلف في دعاء القنوت، وإن كان يروى عن بعضهم في الدعاء خارج الصلاة، وقد روى فيه عن النبى صلى الله عليه وسلم حديث فيه ضعف، وهو مستعمل عند بعضهم خارج الصلاة...**)[٣].

---

(١) رواه ابن ماجة (١١٨١)، وأبوداود (١٤٨٥)، الإرواء (٤٣٤) سنده ضعيف.

(٢) مسائل الإمام أحمد لأبي داود ص٧١.

(٣) إرواء الغليل جـ٢ ص١٨١.

**واته:** دەستهێنان بە دەم و چاودا لەدوای دوعای قنوت هیچ بەڵگەیەکمان پێ نییە لە (صحابة)ەوە، وە گەر لەدەرەوەی نوێژ لێیان دەگێڕنەوە فەرموودەیەکی (ضعیف)ی لەسەرە کاری پێ دەکەن.

## قنوتی نوێژی بەیانیان

بەو شێوەیەی پێشوو بۆمان دەرکەوت کە (قنوت) دوو جۆرە:

١- لەکاتی بوونی بەڵاو ناخۆشی یەکان، ئەمە لەدوای ڕکوع و لەهەموو نوێژە فەرزەکان دا دەکرێت بەبێ جیاوازی ئەگەر زۆرتر دیار بووە بەو نوێژانەی دەنگی تێدا هەڵدەبڕن بەتایبەت بەیانیان، هەروەك لە گێڕانەوەیەکی ئەنەس دا دەڵێت: «كَانَ القُنُوتُ فِي المَغْرِبِ وَالفَجْرِ»[١].

**واته:** کاتی خۆی قنوت دەخوێنرا لە نوێژی ئێوارەو بەیانیان دا[٢].

٢- لە نوێژی وەتر دا و پێش ڕکوع و ئەوەی هەبێت لەسەری ڕیوایەتەکەی (حەسەنی کوڕی عەلی)یە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا کە لە دارِشتنەکەی

(١) رواه البخاري (١٠٠٤).

(٢) بڕوانە (مجموع الفتاوی لإبن تيمية جـ٢٢ ص١٦٢).

«اللهم اهدنا فيمن هديت...»و ناوبەناو دەکرێت لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام نەیکردووە.

کەواتە دەبێت قنوتی نوێژی بەیانیان بە بەردەوامی و بەبێ بوونی کاتی بەڵایەك کە پێویست بکات و خوێندنی قنوتی وەتر لە ڕیوایەتەکەی (حەسەنی کوڕی عەلی) لەکامیان دا جێگەی ببێتەوە؟

ئەوەی بکرێت بە بەڵگە لەسەر قنوتی بەیانیان ئەم ڕیوایەتەیە:

حَدَّثَنَا أَبُو جَعْفَرٍ يَعْنِي الرَّازِيَّ، عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: «**مَا زَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْنُتُ فِي الْفَجْرِ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا**»[1].

**واتە:** بەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی لە بەیانیان دا دەکرد تا لە دونیا دەرچووە.

یەکێك لە گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە (أَبُو جَعْفَرٍ يَعْنِي الرَّازِيَّ) یە، ئیمام أحمد و على المديني و أبو زرعة و إبن حجر لە (تقريب) دا، وە إبن الجوزي لە (العلل المتناهية) ... هەموویان (ضعيف)یان کردووەو دەڵێن: لێتێکچوون و گومان و گێڕانەوەی (مناكير عن

---

(١) رواه أحمد (١٢٦٥٧)، مصنف عبدالرزاق (٤٩٦٤)، سنن الدارقطني (١٦٩٢)، البيهقي في الكبرى (٣١٠٥)، مصنف ابن أبي شيبة (٢٩٢٧٨)، وسنده ضعيف.

المشاهير) شتی هەڵەی لە پیاوە ناودارەکانەوە زۆرە، وەهەروەها إبن القيم رَحِمَهُ ٱللَّهُ لە (زاد المعاد جـ[١] ص[٢٦٦]) و ابن تيمية رَحِمَهُ ٱللَّهُ لە (مجموع الفتاوى جـ[٢٢] ص[١٦٢])دا بە (ضعيف)ی دادەنێن، وەهەروەها شێخ ئەلبانیش. بۆ زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە " السلسلة الضعيفة " للألباني رقم (١٢٣٨).

ئەمە لە ڕووی پلەی (سند)ی فەرموودەکەوە کە (ضعيف)ەو لای کۆی زانایان مایەی وەرگرتن نییە، وە لەڕووی (متن)و مانای فەرموودەکەوە ئەم ڕەخنانەی لەسەرە:

١- پێچەوانەی کۆی ئەو گێڕانەوانەی خودی ئەنەسە کە ڕیوایەتی ئەم فەرموودانە دەکات و هەروەك:

- دان نانی ئەنەس بە هۆکار بۆ قنوت، بە پێچەوانەی قنوتی بەیانیان بەبێ هۆکار: عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ «لَا يَقْنُتُ إِلَّا إِذَا دَعَا لِقَوْمٍ أَوْ دَعَا عَلَى قَوْمٍ»[١].

**واتە:** ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی نەدەخوێند مەگەر کاتێك دوعای بۆ خەڵکێك کردبێت یاخود دوعای لێکردبێتن، واتە قنوتی بەردەوام نەبووە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ بەبێ هۆکار.

(١) صحيح ابن خزيمة (٦٢٠)، سلسلة الأحاديث الصحيحة (٦٣٩)، سنده صحيح.

- دیاری کردنی ماوە بۆ هەموو قنوتێك بەپێچەوانەی بەیانیان بە بەردەوامی هەر لە ئەنەسەوە: عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبْعِينَ رَجُلًا لِحَاجَةٍ... «**فَدَعَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ شَهْرًا فِي صَلاَةِ الغَدَاةِ، وَذَلِكَ بَدْءُ القُنُوتِ، وَمَا كُنَّا نَقْنُتُ**»[١].

**واتە:** وە هەر ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەو حەفتا کەسەی کە شەهیدیان کردن لەڕێگادا، مانگێك لە نوێژی بەیانیان دا قنوتی خوێندو دوعای لێکردن، ئەوە سەرەتای کردنی قنوت بوو، پێش ئەوە نەمان دەکرد.

کەواتە ئەسڵ لە نوێژدا نەبوونی قنوتە بێجگە لەکاتی پێویست نەبێت کە (الأصل في الأشياء) یاسایەکی ئوسوڵی یە بۆ یەکلابوونەوەی هاوشێوەی ئەم بابەتە.

- عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، قَالَ: «... **فَدَعَا النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ شَهْرًا...**»[٢]، وَفِي رِوَايَة عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَـالَ: «**قَنَتَ رَسُولُ اللهِ**

---

(١) رواه البخاري (٤٠٨٨).

(٢) رواه البخاري (٤٠٨٨).

صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهْرًا مُتَتَابِعًا... »(١).

**واتە:** ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ مانگێك بەسەریەكەوە قنوتی خوێندووە.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەردەوام نەبوونی هیچ جۆرە قنوتێك، بەڵكو ئەگەر لەكاتی پێویست دا كرابێت بۆ ماوەیەكی دیاری كراو بووە، بەگوێرەی پێویستی كارەكە یاخود كۆتایی هاتنی.

٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: «كَانَ القُنُوتُ فِي المَغْرِبِ وَالفَجْرِ»(٢).

**واتە:** ئەنەس ﵁ دەڵێت: قنوت لە نوێژی ئێوارەو بەیانی دا دەخوێندرا.

كەواتە بۆچی تایبەت كراوە بە نوێژی بەیانییەوە بێجگە لە ئێوارە؟ وە گەر قنوتی ڕاتیبەیە با ئێوارەش بەردەوام بخوێندرێت!.

٣- عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ الرَّازِي، عَنِ الرَّبِيعِ، عَنْ أَنَسٍ ﵁، «أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَنَتَ فِي الْفَجْرِ»(٣).

---

(١) رواه أبوداود (١٤٤٣)، سنده حسن.

(٢) رواه البخاري (٧٩٨، ١٠٠٤).

(٣) مصنف ابن أبي شيبة (٧٠٠٣).

ئەم ڕیوایەتە بە هەمان ڕێگەی گێڕانەوە (سند)ەکەی (أبو جعفری رازی لە ربیع بن أنس)ە کە هەمان ڕێگەی گێڕانەوەی «مَا زَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْنُتُ فِي الْفَجْرِ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا»یە بەبێ ئەوەی "مازال....حتى فارق الدنيا" (بەردەوام و تا لە دونیا دەرچوە)ی تێدا بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی لە بەیانیان دا خوێندووە. بەبێ ئەوەی باس لە بەردەوام بوونی بکات تا لە دونیا دەرچووە.

بێگومانین لەوەی مەبەستی (قنوت النازلة)یە نەك (راتبة) واتە بەردەوام بوون لەخوێندنی بەیانیان دا بەبێ هیچ هۆکارێك کەخۆی ئەمە هۆکاری دەرچوونە لە سوننەتەکەو خاڵی جیاوازی یە.

وە بۆ زیاتر هەڵوەشاندنەوە و گومان لەسەر ڕیوایەتەکەی (أبو جعفری رازی) لە ئەنەسەوە، ئەوەتا ڕیوایەتێکی ترمان هەیە بە پێچەوانەوە ڕەددی دەکاتەوە کە قنوتی بەیانیان هەبووبێت بەردەوام هەر لە ئەنەسەوە، گەرچی (سند)ی هەردووکیان (ضعیف)ن ئەگەر ئەو ڕیوایەتە کاری پێ بکرێت، ئەوا ئەم لەپێش ترە لەبەر:

١. ڕادەی کەمتری (ضعیف)ەکەی لەڕووی (سند) وە.
٢. لەڕووی (متن)ەوە گونجاندی لەگەڵ ڕیوایەتە (صحیح)ەکان دا.

وە (ابن القيم) لە گێڕانەوەیەکی دا لە ڕێگەی: عَنْ قَيْسِ بْنِ الرَّبِيعِ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ سُلَيْمَانَ قَالَ: قُلْنَا لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: «إِنَّ قَوْمًا يَزْعُمُونَ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ يَزَلْ يَقْنُتُ بِالْفَجْرِ، قَالَ: كَذَبُوا، وَإِنَّمَا قَنَتَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَهْرًا وَاحِدًا يَدْعُو عَلَى حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ».

**واتە:** دەڵێن خەڵکێك دەڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام بەیانیان قنوتی دەخوێند، ووتی: بەهەڵەدا چوون، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ یەك مانگ قنوتی خوێند و دوعای لەهەندێك هۆزی عەرەب کرد.

ابن القيم رحمه الله دەڵێت: ڕێگەی ئەم ڕیوایەتە (سند) گەرچی (ضعيف)ە، بەهێزترە تاوەکو ڕیوایەتەکەی (أبو جعفر الرازي)، کەواتە چۆن دەبێت ئەم ڕێگەیە بەبەڵگە نەکرێت تاوەکو ئەو؟! وە زۆری زانایان (أبو جعفر)یان (ضعيف)تر کردووە تاوەکو (قيس بن الربيع).[1]

- ابن تيمية رحمه الله دەڵێت: (وَأَمَّا أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو فِي الْفَجْرِ دَائِمًا... فَهَذَا بَاطِلٌ قَطْعًا وَكُلُّ مَنْ تَأَمَّلَ الْأَحَادِيثَ الصَّحِيحَةَ عَلِمَ هَذَا

(١) زاد المعاد جـ١ ص٢٦٩.

بِالضَّرُورَةِ وَعَلِمَ أَنَّ هَذَا لَوْ كَانَ وَاقِعًا لَنَقَلَهُ الصَّحَابَةُ وَالتَّابِعُونَ وَلَمَا أَهْمَلُوا قُنُوتَهُ الرَّاتِبَ الْمَشْرُوعَ لَنَا...) .[(١)]

**واته:** گەر پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام لەنوێژی بەیانیان دا قنوتی خوێندبێت، كە ئەمە بەهیچ شێوەیەك ڕاست نییە، بەڵكو ئەوەی بڕوانێتە فەرموودە (صحیح)ەكان ئەمەی زۆر بە ڕوون و ئاشكرا بۆ دەردەكەوێت، وە دەزانێت گەر ئەمە ڕووی دابوایە دەبوایە كۆمەڵگای (صحابة) و (تابعين) پشت گوێیان نەخستایە و بۆ چینەكانی دوای خۆیان (نقل) كردایە.

وە ابن القيم رحمه الله دەڵێت: (لَوْ كَانَ يَقْنُتُ كُلَّ غَدَاةٍ وَيَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ وَيُؤَمِّنُ الصَّحَابَةُ لَكَانَ نَقْلُ الْأُمَّةِ لِذَلِكَ كُلِّهِمْ كَنَقْلِهِمْ لِجَهْرِهِ بِالْقِرَاءَةِ فِيهَا وَعَدَدِهَا وَوَقْتِهَا... وَالْإِنْصَافُ الَّذِي يَرْتَضِيهِ الْعَالِمُ الْمُنْصِفُ، أَنَّهُ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَهَرَ وَأَسَرَّ، وَقَنَتَ وَتَرَكَ،... وَتَرْكُهُ الْقُنُوتَ أَكْثَرَ مِنْ فِعْلِهِ، فَإِنَّهُ إِنَّمَا قَنَتَ عِنْدَ النَّوَازِلِ لِلدُّعَاءِ لِقَوْمٍ،... وَلَمْ يَخْتَصَّ بِالْفَجْرِ)[(٢)].

---

(١) مجموع الفتاوى جـ٢٢ ص١٦٣.

(٢) زاد المعاد جـ١ ص٢٦٣.

**واته:** گەر هەموو بەیانییەك پێغەمبەری خوا ﷺ قنوتی بخوێندایە و هاوەڵان ئامینیان لەسەر بکردایە، دەبوایە کۆمەڵی موسوڵمانان ئەمەیان بگەیاندایە وەك چۆن دەنگ هەڵبڕین لەناو نوێژداو ژمارەو کاتەکانی و... هەموویان بە ووردی گەیاندووە.

ئەو ڕاستییەی زانایان پێی ڕازین ئەوەیە: قنوتی خوێندووەو نەیخوێندووە، وە نەخوێندنی زۆرتر بووە لە خوێندنی، وە کاتیّ خوێندوویەتی کاتی بەڵاو ناخۆشییەکان بووە، وە تایبەت نەبووە بە نوێژی بەیانییەوە.

وە دەڵێت: وَمِنَ الْمُحَالِ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ فِي كُلِّ غَدَاةٍ بَعْدَ اعْتِدَالِهِ مِنَ الرُّكُوعِ يَقُولُ: «**اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ**» إِلَخْ، وَيَرْفَعُ بِذَلِكَ صَوْتَهُ وَيُؤَمِّنُ عَلَيْهِ أَصْحَابُهُ دَائِمًا إِلَى أَنْ فَارَقَ الدُّنْيَا، ثُمَّ لَا يَكُونُ ذَلِكَ مَعْلُومًا عِنْدَ الْأُمَّةِ، بَلْ يُضَيِّعُهُ أَكْثَرُ أُمَّتِهِ، وَجُمْهُورُ أَصْحَابِهِ بَلْ كُلُّهُمْ، حَتَّى يَقُولَ مَنْ يَقُولُ مِنْهُمْ: إِنَّهُ مُحْدَثٌ[1].

**واته:** مەحاڵە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو بەیانییەك لەدوای (سمع

---

(١) زاد المعاد جـ١ ص٢٦٣.

الله لمن حمده) (اللَّهُمَّ اهْدِنِي...)ی خوێندبێ و دەنگی پێ بەرز کردبێتەوەو هاوەڵانیش ئامینیان بەدوای دا کردبێت، تا لە دونیا دەرچووە، پاشان لای موسوڵمانان و تەنانەت کۆی (صحابة)کان نادیار بێت و بوونی ئەم قنوتە نەبێت، بەڵکو بگاتە ئەو ئاستەی هەندێك لە هاوەڵان بڵێن داهێنراوە وەك:

- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ سَعْدِ بْنِ طَارِقٍ، قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي: يَا أَبَتِ إِنَّكَ قَدْ صَلَّيْتَ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ وَعَلِيٍّ هَاهُنَا بِالْكُوفَةِ، نَحْوًا مِنْ خَمْسِ سِنِينَ، «فَكَانُوا "أَكَانُوا" يَقْنُتُونَ فِي الْفَجْرِ؟» فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ مُحْدَثٌ[1]، فِي رِوَايَة: يَا بُنَيَّ إِنَّهَا بِدْعَةٌ[2].

**واتە:** ئەبو مالیك بە باوكی دەڵێت كە ناوی (طارق بن أشيم)ەو هاوەڵی پێغەمبەری خوایە ﷺ: ئەی باوكە تۆ نوێژت لەپشت پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەكرو عومەرو عەلی كوڕی ئەبوطالیب لێرەدا لە كوفە پێنج ساڵ كردووە، ئایا ئەوان قنوتیان خوێندووە؟

---

(١) رواه الترمذي (٤٠٢)، وابن ماجة (١٢٤١)، وأحمد (١٥٨٧٩)، سنده صحيح.

(٢) النسائي في السنن الكبرى (٦٧١)، مصنف ابن أبي شيبة (٧٠٣٤).

ووتی: ئەی كوڕم ئەوە تازەو داهێنراوە (بدعة)یە.

بێگومان ئەم هاوەڵە بەڕێزە نەبوونی قنوتی بەردەوامی بەیانیانی مەبەستە، هەروەك:

- عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ ابْنِ عُمَرَ صَلَاةَ الصُّبْحِ فَلَمْ يَقْنُتْ، فَقُلْتُ لِابْنِ عُمَرَ: لَا أَرَاكَ تَقْنُتُ قَالَ: "لَا أَحْفَظُهُ عَنْ أَحَدٍ مِنْ أَصْحَابِنَا"(١)، وَفِي رِوايَة عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ مَنْصُورٍ، وَالْأَعْمَشُ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ عَنِ الْقُنُوتِ فِي الْفَجْرِ، فَقَالَ: «مَا شَعُرْتُ أَنَّ أَحَدًا يَفْعَلُهُ»(٢).

**واتە:** نوێژێكی بەیانیمان كرد لەگەڵ عبدالله ی كوڕی عومەردا قنوتی نەخوێند، ووتم: نەمبینی قنوت بخوێنی، ووتی: نەم بینیوە لە كەسێك لە هاوەڵانمەوە، یاخود ووتی: نەمبینیوە كەسێك بیكات.

وە لە گێڕانەوەیەك دا ووتی: «مَا شَهِدْتُ، وَلَا عَلِمْتُ»(٣).

**واتە:** نە زانیومەو نە بینیومە لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ.

---

(١) البيهقي في الكبرى (٣١٥٧)، سنده حسن.

(٢) مصنف عبدالرزاق (٤٩٥٤).

(٣) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٧٧).

- وعن سعيد بن جبير قال:"إن القنوت في صلاة الفجر بدعة".[١]

**واتە:** سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: قنوتی نوێژی بەیانیان (بەردەوام) داهێنراوە.

بۆ زیاتر دڵنیا بوون لەسەر نەبوون و نەکردنی قنوتی بەردەوامی بەیانیان بەبێ هیچ هۆکارێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە ﷺ هەندێك ڕیوایەت دەخەینە ڕوو:

١- عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ، وَعَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ: «أَنَّهُمَا صَلَّيَا خَلْفَ عُمَرَ الْفَجْرَ، فَلَمْ يَقْنُتْ»[٢].

**واتە:** ئەسوەدو عەمر دەڵێن: نوێژی بەیانیمان لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه کرد قنوتی نەخوێند.

٢- عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ قَيْسٍ: «أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ، لَمْ يَكُنْ يَقْنُتُ فِي الْفَجْرِ»[٣].

**واتە:** عبدالله ی کوڕی مەسعود بەیانیان قنوتی نەدەخوێند.

---

(١) إرواء الغليل (٤٣٦) تحقيق الثاني، وليس من قول ابن عباس.

(٢) مصنف عبدالرزاق (٤٩٤٨، ٤٩٥١)، مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٦٤، ٦٩٦٥).

(٣) مصنف عبدالرزاق (٤٩٦٣)، مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٦٧).

٣- عَنْ طَلْحَةَ، «أَنَّ أَبَا بَكْرٍ لَمْ يَقْنُتْ فِي الْفَجْرِ»[١].

**واته:** ئەبو بەکر ﵁ قنوتی بەیانیانی نەدەخوێند.

٤- وفي مصنف ابن أبي شيبة رواية أن عثمان بن عفان (٧٠٦٣)، وابن عباس (٧٠٦٨)، وسعيد بن جبير (٧٠٦٩)، وإبراهيم النخعي (٧٠٦٧) لم يكونوا يقنتون في الفجر.

**واته:** ئەم هاوەڵ و تابیعی یە بەڕێزانە (عثمانی کوڕی عەفان و عبدالله ی کوڕی عەبباس و سەعیدی کوڕی جوبەیرو إبراهیمی نەخەعی ﵃). هیچیان قنوتی بەردەوامی بەیانیانیان نەخوێندووە.

٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُحَرَّرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: «قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَهُمْ لَا يَقْنُتُونَ»[٢]، وَعَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ، عَنِ ابْنِ أَبِي نَجِيحٍ قَالَ: سَأَلْتُ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ: هَلْ كَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ يَقْنُتُ فِي الصُّبْحِ؟ قَالَ: «لَا، إِنَّمَا هُوَ شَيْءٌ أَحْدَثَهُ النَّاسُ بَعْدُ»[٣].

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٧٤).

(٢) مصنف عبدالرزاق (٤٩٤٦).

(٣) مصنف عبدالرزاق (٤٩٥٥).

**واتە:** ئیمامی زوهری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکرو عومەر وەفاتیان کرد قنوتیان نەدەخوێند. وە پرسیار لە سالمی کوڕی عبداللە کرا: ئایا عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ بەیانیان قنوتی دەخوێند؟ ووتی: نەخێر بەڵکو کارێکە خەڵکی لە دوایی دا دایانهێناوە.

- وە ئەو گێڕانەوانەی هەیە لەسەر کردنی قنوتی بەیانیان بێگومانین لەوەی مەبەست لە کردنیان بۆ کاتی بەڵاو ناخۆشی یەکان بووەو کاتییش بووە هەروەك:

١- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: ذَاكَرْتُ أَبَا جَعْفَرٍ الْقُنُوتَ، فَقَالَ: «خَرَجَ عَلِيٌّ مِنْ عِنْدِنَا، وَلَمْ يَقْنُتْ، وَإِنَّمَا قَنَتَ بَعْدَمَا أَتَاكُمْ»[١].

**واتە:** محمد باقر (أبا جعفر) دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ تا لە (مەدینە) لای ئێمە بوو قنوتی نەدەخوێند، کاتێك هاتە لای ئێوە (کوفە) قنوتی خوێند.

وەك (ابن عباس) ﵄ دەڵێت: «...ولَا قَنَتَ عَلِيٌّ حَتَّى حَارَبَ أَهْلَ الشَّامِ، فَكَانَ يَقْنُتُ فِي الصَّلَوَاتِ كُلِّهِن...»[٢].

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٩٣).

(٢) مصنف عبدالرزاق (٤٩٥٣).

**واتە:** عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ قنوتی نەدەخوێند تا لەگەڵ خەڵکی شام دا شەڕ دروست بوو، ئەو کاتە قنوتی لەهەموو نوێژە فەرزەکان دا دەخوێند.

وە لەسەرەتای کردنیشی دا دژایەتی کرا، وەك ئیمامی شەعبی دەڵێت: «...لَمَّا قَنَتَ عَلِيٌّ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ، أَنْكَرَ النَّاسُ ذَلِكَ...»(١).

**واتە:** کاتێك عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ لە نوێژی بەیانیان دا قنوتی خوێند خەڵك دژایەتی دەکرد.

٢- وَفِي رِوايَة: «أَنَّ أَبَا بَكْرٍ، قَنَتَ فِي الْفَجْرِ»(٢)، «رُبَّمَا قَنَتَ عُمَرُ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ»(٣).

**واتە:** ئەبو بەکرو عومەر ﷺ ڕەنگە لە نوێژی بەیانی دا قنوتیان خوێندبێت.

ئەمەش دیارە بۆ ئەو هۆکارانەی پێشوو دەگەڕێتەوە لەکاتی بەڵاو شەڕەکان دا کە پێویستیان بە دوعا بووە، هەروەکو إبن القيم ﷺ دەڵێت: (وَأَمَّا الْمَرْوِيُّ عَنِ الصَّحَابَةِ فَنَوْعَانِ:

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة (٦٩٨٢).

(٢) مصنف ابن أبي شيبة (٧٠٠١).

(٣) مصنف ابن أبي شيبة (٧٠٠٦).

**أَحَدُهُمَا**: قُنُوتٌ عِنْدَ النَّوَازِلِ، كَقُنُوتِ الصِّدِّيقِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فِي مُحَارَبَةِ الصَّحَابَةِ لمسيلمة، وَعِنْدَ مُحَارَبَةِ أَهْلِ الْكِتَابِ، وَكَذَلِكَ قُنُوتُ عمر، وَقُنُوتُ علي عِنْدَ مُحَارَبَتِهِ أَهْلِ الشَّامِ

**الثَّانِي**: مُطْلَقٌ، مُرَادُ مَنْ حَكَاهُ عَنْهُمْ بِهِ تَطْوِيلُ هَذَا الرُّكْنِ لِلدُّعَاءِ وَالثَّنَاءِ، وَاللهُ أَعْلَمُ)[1].

**واتە: ئەو گێڕانەوانەی لە (صحابة) وە دەگێڕدرێنەوە لەسەر قنوت دوو جۆرە:**

**یەکەم: قنوت لەکاتی دابەزینی بەڵاکان دا، وەك: قنوتەکەی ئەبو بەکر ﵁ لەکاتی شەڕی (موسەیلەمە)دا، وە لەکاتی شەڕی گاورەکان دا وەك لەسەردەمی عومەردا ﵁، وە هەروەها قنوتی عەلی ﵁ لەکاتی شەڕەکەی دا لەگەڵ خەڵکی شام.**

قال النووي ﵀: **(واعلم أن المنقول عن عمر ﵁ " عذّب كفرة أهل الكتاب "، لأن قتالهم ذلك الزمان كان مع كفرة أهل الكتاب...)**[2].

---

(١) زاد المعاد جـ١ ص٢٧٦.

(٢) الأذكار (٦١) بتحقيق الأرنؤوط.

**واته:** ئیمامی نەوەوی دەڵێت: ئەو جۆرە قنوتەی عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه خوێندوویەتی لەکاتی شەڕکردن دا بووە لەگەڵ گاورەکان دا.

**دووەم:** قنوتی گشتی، ئەوانەی گێڕانویانەتەوە مەبەست پێی درێژکردنەوەی وەستانی دوای ڕکوع بووە بۆ پاڕانەوەو وەسف و ستایشی پەروەردگار.

وە **دەڵێت:** (فَنَقُولُ وَبِاللَّهِ التَّوْفِيقُ: أَحَادِيثُ أنس كُلُّهَا صِحَاحٌ، يُصَدِّقُ بَعْضُهَا بَعْضًا، وَلَا تَتَنَاقَضُ، وَالْقُنُوتُ الَّذِي ذَكَرَهُ قَبْلَ الرُّكُوعِ غَيْرُ الْقُنُوتِ الَّذِي ذَكَرَهُ بَعْدَهُ، وَالَّذِي وَقَّتَهُ غَيْرُ الَّذِي أَطْلَقَهُ، فَالَّذِي ذَكَرَهُ قَبْلَ الرُّكُوعِ هُوَ إِطَالَةُ الْقِيَامِ لِلْقِرَاءَةِ، وَهُوَ الَّذِي قَالَ فِيهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «**أَفْضَلُ الصَّلَاةِ طُولُ الْقُنُوتِ**»، وَالَّذِي ذَكَرَهُ بَعْدَهُ هُوَ إِطَالَةُ الْقِيَامِ لِلدُّعَاءِ،... ثُمَّ اسْتَمَرَّ يُطِيلُ هَذَا الرُّكْنَ لِلدُّعَاءِ وَالثَّنَاءِ إِلَى أَنْ فَارَقَ الدُّنْيَا، كَمَا فِي " الصَّحِيحَيْنِ " عَنْ ثابت، عَنْ أنس قَالَ: «**إِنِّي لَا أَزَالُ أُصَلِّي بِكُمْ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِنَا**»، قَالَ: وَكَانَ أنس... إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ انْتَصَبَ قَائِمًا حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ: قَدْ نَسِيَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ

السَّجْدَةِ يَمْكُثُ حَتَّى يَقُولَ الْقَائِلُ: قَدْ نَسِيَ. فَهَذَا هُوَ الْقُنُوتُ الَّذِي مَا زَالَ عَلَيْهِ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا)(١).

**واتە:** فەرموودەکانی ئەنەس ﵁ کە گێڕاویەتییەوە لە قنوت دا هەموویان (صحیح)ن یەکتری بەڕاست دەخەنەوە و پێچەوانەی یەکتریان تێدا نییە، ئەوەی پێش ڕکوع قنوتی دوای ڕکوع نییە، ئەوەی تایبەتی کردووە ئەوە نییە بە گشتی باسی کردووە، ئەوەی پێش ڕکوع مەبەست پێی قورئان خوێندنی زۆرە، وەك پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: باشترین نوێژ ئەو نوێژەیە کە قورئانی زۆری تێدا بخوێنرێت، ئەوەی پاش ڕکوع مەبەست تیایدا وەستانی زۆر بووە بۆ زیکرو ستایش کردن... پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوانە هەموو بەشەکانی نوێژی بە مانەوەی زۆرو پاڕانەوەو زیکر بردۆتە سەر تا لە دونیا دەرچووە.

هەروەك ئەنەس ﵁ دەڵێت: بەردەوام من وا نوێژتان بۆ دەکەم وەك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بۆمان کردووە، ئەنەس ئەگەر سەری لە ڕکوع بەرزکردایەتەوە ئەوەندە دەوەستا تا دەیان ووت لەبیری چووە، وە سەری لە سوجدە بەرز کردایەتەوە ئەوەندە دەمایەوە تا دەیان ووت لەبیری چووە... ئەمە شێوەی عیبادەتی بەردەوامی بووە

---

(١) زاد المعاد جـ١ ص٢٧٣.

تا لە دونیا دەرچووە.

کەواتە زۆر مانەوە لە بەشەکانی نوێژدا پێی وتراوە قنوت، وە سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ لە نوێژدا بە هاوشێوەی یەك بووە، گەر قورئانی زۆر خوێندبێت ئەوا لە ڕکوع دا نزیکەی ئەوەندەی بەپێوەبوون ماوەتەوە و لەدوای ڕکوعیش لەوە کەمتر ماوەتەوە، وە لە سەجدەی یەکەم دا لەوە کەمتر ماوەتەوە و نێوان هەردوو سەجدە کەمتر لە سەجدەی یەکەم ماوەتەوە وە سەجدەی دووەم کەمتر لە دانیشتنی نێوان هەردوو سەجدەکە ماوەتەوە، وە ڕکاتی دووەم کەمتر لە یەکەم قورئانی تێدا خوێندووەو وە هەموو بەشەکانی کەمتر لە ڕکاتی یەکەم دوورو درێژتر بووە. وە هەروەها گەر سێ ڕکاتی یان چوار ڕکاتی بوبێت کەمتری کردوەتەوە تا کۆتایی نوێژ کەمترین کاتی بووە. دیارە بۆ گرنگی دان بووە بە توانای نوێژخوێن کە لە سەرەتاوە توانای زۆرە تا کۆتایی... هەروەك (براء ابن عازب) دەڵێت: «رَمَقْتُ الصَّلَاةَ مَعَ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَوَجَدْتُ قِيَامَهُ فَرَكْعَتَهُ، فَاعْتِدَالَهُ بَعْدَ رُكُوعِهِ، فَسَجْدَتَهُ، فَجَلْسَتَهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، فَسَجْدَتَهُ، فَجَلْسَتَهُ مَا بَيْنَ التَّسْلِيمِ وَالِانْصِرَافِ، قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ»[١].

---

(١) رواه مسلم (١٠٥٧)، وعند البخاري بلفظ آخر (٧٩٢).

**واتە:** سەیری نوێژی پێغەمبەرم كرد ﷺ وەستانی ڕكوع و سەجدەو دانیشتنی نێوانیان و سەجدەی كۆتایی و دانیشتنی (تحيات)ی نزیك بوون لەیەكەوە، كەواتە ئەم جۆرە مانەوانەی نوێژ لە زاراوەی (صحابة)دا پێی دەوترێت (قنوت) نەك ئەو دوعا تایبەتییە لە زاراوەی پاشووەكان دا.

وە دەڵێت: فَإِنَّ الْقُنُوتَ يُطْلَقُ عَلَى الْقِيَامِ، وَالسُّكُوتِ، وَدَوَامِ الْعِبَادَةِ، وَالدُّعَاءِ، وَالتَّسْبِيحِ، وَالْخُشُوعِ، كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿وَلَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ [الروم: ٢٦]، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْأٓخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ﴾ [الزمر: ٩]، وَقَالَ تَعَالَى: ﴿وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ﴾ [التحريم: ٢٦]، وَقَالَ ﷺ: «**أَفْضَلُ الصَّلَاةِ طُولُ الْقُنُوتِ**»[1]. وَقَالَ زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ: لَمَّا نَزَلَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴾ [البقرة: ٢٣٨]، «**أُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ، وَنُهِينَا عَنِ الْكَلَامِ**»[2].

---

(١) رواه مسلم (١٧٦٥).

(٢) رواه البخاري (١٢٠٠)، ومسلم (١٢٠٣).

وَأَنَس رضي الله عنه لَمْ يَقُلْ: لَمْ يَزَلْ يَقْنُتُ بَعْدَ الرُّكُوعِ رَافِعًا صَوْتَهُ «**اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ**»... إِلَى آخِرِهِ وَيُؤَمِّنُ مَنْ خَلْفَهُ، وَلَا رَيْبَ أَنَّ قَوْلَهُ: «**رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ**»، إِلَى آخِرِ الدُّعَاءِ وَالثَّنَاءِ الَّذِي كَانَ يَقُولُهُ قُنُوتٌ، وَتَطْوِيلَ هَذَا الرُّكْنِ قُنُوتٌ، وَتَطْوِيلَ الْقِرَاءَةِ قُنُوتٌ، وَهَذَا الدُّعَاءَ الْمُعَيَّنَ قُنُوتٌ، فَمِنْ أَيْنَ لَكُمْ أَنَّ أنسا إِنَّمَا أَرَادَ هَذَا الدُّعَاءَ الْمُعَيَّنَ دُونَ سَائِرِ أَقْسَامِ الْقُنُوتِ[1].

**واته:** قنوت لە پێناسەی قورئان و فەرموودە دا بۆ زۆر ماناو لێکدانەوەی تر دێت لەوانە:

١- **بۆ وەستان (القيام):** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَـٰنِتُونَ﴾ [الروم: ٢٦].

٢- **بەردەوامی و مانەوە لە عیبادەت دا:** ﴿أَمَّنْ هُوَ قَـٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ﴾ [الزمر: ٩]، **وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:** «**أَفْضَلُ الصَّلَاةِ طُولُ الْقُنُوتِ**»[2].

---

(١) زاد المعاد جـ١ ص٢٦٧.

(٢) رواه مسلم (١٧٦٥)، والترمذي (٣٨٧).

**واته:** باشترین نوێژ مانەوەی زۆرە.

٣- **دوعاو پاڕانەوە:** وەکو قنوت خوێندن.

٤- **بێدەنگی و ملکەچ بوون:** وەك: زەیدی کوڕی ئەرقەم دەڵێت: لە نوێژدا ئەوەی لەلایەوە نوێژی دەکرد قسەی دەکرد لەگەڵ پەنای دا تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴾ [البقرة: ٢٣٨]، فەرمانمان پێدرا بێدەنگ بین و قسە نەکەین.

وە ئەنەس ﷺ نەی وتووە بەردەوام دوای ڕکوع بەدەنگی بەرز لە قنوت دا ئەمەی دەخوێند: «**اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ...**».

٥- بە مانای زیکری دوای (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) دێت: وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، مِلْءَ السَّمَوَاتِ...».

٦- بە مانای زۆر قورئان خوێندن دێت لە نوێژدا، وە بە مانای ئەم قنوت خوێندنە کە خەڵك دەیخوێنێت دێت.

کەواتە لە کوێوە بە چ بەڵگەیەك دەی سەلمێنن (ئەنەس) مەبەستی پێی ئەم دوعای قنوتە تایبەتەیە «**اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ...**»؟ بەبێ ئەم ماناو مەبەستانەی پێشووتر، بە مەرجێك دارشتنی ئەنەس ﷺ لە گێڕانەوەکەدا دیاری نەکردووە.

وه تەنانەت نوێژی بەیانی به قورئان ناوبراوه وەكو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا﴾ [الإسراء: ٧٨].

كەواته ئەوەی لـه مەبەستی (ئەنەس)ەوه زۆر نزيك بێت وه واقعی هەموو ژيانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوه بووبێت تا لـه دونيا دەرچووه ئەوەيه مەبەستی به قنوتەكه قورئان خوێندن و دوورو درێژی نوێژەكەی بەيانيانی پێغەمبەری خوا ﷺ بووه نەك ئەو دوعای قنوته مەشهوره. وه هۆكاری ئەم تێگەيشتنه هەڵەيه دەگەڕێتەوه بۆ بەهەڵە پێناسه بۆكردنی. وەك ابن القيم رَحِمَهُ ٱللَّهُ دەڵێت: (وَلَمَّا صَارَ الْقُنُوتُ فِي لِسَانِ الْفُقَهَاءِ وَأَكْثَرِ النَّاسِ هُوَ هَذَا الدُّعَاءَ الْمَعْرُوفَ «**اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ**» إِلَى آخِرِهِ، وَسَمِعُوا أَنَّهُ لَمْ يَزَلْ يَقْنُتُ فِي الْفَجْرِ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا، وَكَذَلِكَ الْخُلَفَاءُ الرَّاشِدُونَ وَغَيْرُهُمْ مِنَ الصَّحَابَةِ حَمَلُوا الْقُنُوتَ فِي لَفْظِ الصَّحَابَةِ عَلَى الْقُنُوتِ فِي اصْطِلَاحِهِمْ، وَنَشَأَ مَنْ لَا يَعْرِفُ غَيْرَ ذَلِكَ، فَلَمْ يَشُكَّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابَهُ كَانُوا مُدَاوِمِينَ عَلَيْهِ كُلَّ غَدَاةٍ، وَهَذَا هُوَ الَّذِي نَازَعَهُمْ فِيهِ جُمْهُورُ الْعُلَمَاءِ وَقَالُوا: لَمْ يَكُنْ هَذَا مِنْ فِعْلِهِ الرَّاتِبِ، بَلْ وَلَا يَثْبُتُ عَنْهُ

أَنَّهُ فَعَلَهُ)[١].

**واته:** كاتێك پێناسەی قنوت كرا لەسەر زمانی زانایان و خەڵكی كه خوێندنی ئەم جۆره قنوتەیه، وه بیستیشیان پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی خوێندوویانه بەردەوام.

وا تێگەیشتن كه هاوەڵان (صحابة) له باسكردنی قنوت دا مەبەستیان هەمان مەبەسته بۆیه بوو به هۆكاری تێكەڵبوونی زاراوەی هاوەڵان و زانایانی دوای ئەوان.

وه كەسانێك بێ ئاگابوون لەسەر ئەم جیاوازییه بووه هۆكاری ئەوەی ببێگومان بن لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەردەوام بەیانیان ئەو جۆره قنوتەیان خوێندووه.

ئەمه خاڵی ناكۆكی كۆی زانایانه، دەڵێن گەر وابێت بۆ خوێندنی قنوت كاری بەردەوامی پێغەمبەر ﷺ نەبووه، وه تەنانەت هیچ بەڵگەیەكیشمان نییه لەسەری.

زۆر پێویسته ئاگاداری زاراوه زانستییەكانی نێوان زانایانی (سلف و خلف) بین له هەموو بوارەكان دا تاوەكو چاوڕۆشنی تەواوو گەیشتن به ئەنجامی ڕاست و دروستی بابەتەكان بەدەست بێنین، یاخود

---

(١) زاد المعاد جـ١ ص٢٧٤.

شارەزابوونی تەواو بەسەر ووردەکاری و چۆنییەتی ئەو ڕیوایەتانەی دەمانەوێت بیکەین بە بەڵگە بۆ بابەتێك زۆرجار دەبێتە گەیشتن بە یەکلابوونەوە.

وەك (ابن القیم) رَحِمَهُ ٱللَّهُ هەر لەبارەی ئەم قنوتەوە دەڵێت: (وَالْقُنُوتُ فِي الْوِتْرِ مَحْفُوظٌ عَنْ عمر، وَابْنِ مَسْعُودٍ، وَالرِّوَايَةُ عَنْهُمْ أَصَحُّ مِنَ الْقُنُوتِ فِي الْفَجْرِ، وَالرِّوَايَةُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي قُنُوتِ الْفَجْرِ، أَصَحُّ مِنَ الرِّوَايَةِ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ. وَاللهُ أَعْلَمُ)[1].

**واتە:** ئەو ڕیوایەتانەی لەسەر قنوتی وەتر هەیە لە (عومەری کوڕی خەتتاب و عبداللە ی کوڕی مەسعود)ەوە زۆرترو (صحیح) ترن تا قـنوتی بەیانیان، بەڵام ئەو ڕیوایەتانەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەیە لەسەر قنوتی بەیانیان (صحیح) ترو زۆرترن تا قنوتی وەتر.

**واتە:** ئەمە بووەتە هۆکاری هەڵە تێگەیشتن کاتێك سەیری ئەو ڕیوایەتانە دەکەن (صحابة) قنوتیان خوێندووە لە وەتر دا بەتایبەت لە ڕەمەزان دا وە دوعاشیان تێدا کردووە، وە سەیری ئەو ڕیوایەتانەش دەکەن پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی بەڵاکان دا قنوتی خوێندووە لە نوێژە فەرزەکان دا بەتایبەت بەیانی. گەیشتوونەتە ئەو تێگەیشتنەی

---

(١) زاد المعاد جـ١ ص٣٢٤.

نوێژی بەیانیان قنوت بکرێت بەردەوام وە دوعای قنوتی وەتریشی تێدا بخوێندرێت. لەگەڵ ئەوەش دا دەبوایە وا تێبگەیشتنایە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیانی دا قنوتی لەکاتی بوونی بەڵادا بۆ ماوەیەك بەو دوعایەی پێویستییەتی خوێندووە بەبێ بەردەوامی لەهەموو فەرزەکان دا لە کۆتا ڕکات دا لەدوای ڕکوع. وە قنوتی وەتریشی ناوبەناو خوێندووە، بەبێ بەردەوامی بەو دوعایەی حەسەنی کوڕی عەلی رضي الله عنهما لە کۆتا ڕکاتی وەتردا پێش ڕکوع.

بەم شێوەیە بۆمان دەردەکەوێت بەبێ تێکەڵبوون قنوتی نوێژی بەیانیان (بەڕاتیبەیی) واتە بەردەوام، هیچ بنەمایەکی زانستی نییەو زیادکردنە لە نوێژی بەیانیان.

## ڕوونکردنەوەیەک

پاش یەکلابوونەوەی قنوت بەشێوەیەکی زانستی بەڵگەدار، پرسیارێك دێتە ئاراوە:

**پرسیار:** گەر پێشنوێژ قنوتی بەیانیانی بەردەوام خوێندو گوێی بەم بەڵگەو ڕوونکردنەوانەی زانایان نەدا، ئایا نوێژخوێن چاو لە (ئیمام) بکات دەست هەڵبڕێت و (ئامین) بکات یاخود نەیکات؟

**وەڵام:** بۆ ئەم پرسیارە دەقێکی (ابن تيمية) رَحِمَهُ اللَّهُ دەکەین بە وەڵام کە دەفەرموێت: (وَلِهَذَا يَنْبَغِي لِلْمَأْمُومِ أَنْ يَتْبَعَ إمَامَهُ فِيمَا يَسُوغُ فِيهِ الِاجْتِهَاد فَإِذَا قَنَتَ قَنَتَ مَعَهُ وَإِنْ تَرَكَ الْقُنُوتَ لَمْ يَقْنُتْ فَإِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «**إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ**»[1]. وَقَالَ: «لَا تَخْتَلِفُوا عَلَى أَئِمَّتِكُمْ»[2]. وَثَبَتَ عَنْهُ فِي الصَّحِيحِ أَنَّهُ قَالَ: «يُصَلُّونَ لَكُمْ فَإِنْ أَصَابُوا فَلَكُمْ وَلَهُمْ وَإِنْ أَخْطَئُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ»[3]. فَإِذَا قَنَتَ لَمْ يَكُنْ لِلْمَأْمُومِ أَنْ يُسَابِقَهُ: فَلَا بُدَّ مِنْ مُتَابَعَتِهِ وَلِهَذَا كَانَ عَبْدُ

---

(١) رواه البخاري (٤١١).

(٢) رواه مسلم (٤١٤).

(٣) رواه مسلم (١٨٥٥).

اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ قَدْ أَنْكَرَ التَّرْبِيعَ بِمِنَى ثُمَّ إِنَّهُ صَلَّى خَلْفَهُ أَرْبَعًا. فَقِيلَ لَهُ فِي ذَلِكَ فَقَالَ: الْخِلَافُ شَرٌّ)[١].

**واتە:** پێویستە نوێژخوێن شوێنکەوتەی پێشنوێژ بێت لەوبابەتانەی شوێنی ئیجتیهادی زانایانە (واتە: بیٚ بناغە نییە). کاتێك قنوتی خوێند بخوێنێت لەگەڵی دا، گەر نەیخوێند نەیخوێنێت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «**پێشنوێژ بۆیە دانراوە شوێن کەوتەی بیت**»، وە فەرموویەتی: «**دووبەرەکایەتی مەخەنەوە لەگەڵ ئیمامەکانتانا**»، وە لە فەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی: «**نوێژتان بۆ دەکەن گەر پێکایان پاداشتی ئێوەو ئەوانی تێدایە، گەر هەڵەیان کرد پاداشتی ئێوەیە، وە تاوان لەسەر ئەوانە**».

گەر پێشنوێژ قنوتی خوێند دەبێت نوێژخوێن لەشوێنکەوتەی (متابعة)ی دەرنەچێت، هەروەك (عبداللّٰه ی کوڕی مەسعود) دژایەتی نوێژی چوار ڕکاتی کرد لە میناداا، پاشان نوێژەکەی بە چوار ڕکات کرد لەگەڵ ئیمام دا، پێیان ووت: خۆ تۆ دژایەتیت کرد، فەرمووی: «**دووبەرەکایەتی شەڕە**».

(١) مجموع الفتاوى (٢٢/ ١١٦).

قال الشيخ العثيمين رَحِمَهُ ٱللَّهُ: (القول الراجح في هذه المسألة أنه لا قنوت في صلاة الفجر؛ لأن ذلك لم يثبت عن النبي صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فإن النبي صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لم يقنت في الفرائض إلا بسبب نوازل نزلت بالأمة الإسلامية،...لكن من ائتم بإمام يقنت في صلاة الفجر فلا ينفرد عنه، بل يتابعه ويقف، ويؤمن على دعائه، هكذا نص عليه الإمام أحمد رَحِمَهُ ٱللَّهُ وإنما نص رَحِمَهُ ٱللَّهُ على هذا؛ لأن الخلاف شر، والخروج عن الجماعة شر)[1].

وبالجملة فتخصيص صلاة الصبح بالقنوت من المسائل الخلافية الاجتهادية، فمن صلى وراء إمام يقنت في الصبح خاصة قبل الركوع أو بعده فعليه أن يتابعه، وإن كان الراجح الاقتصار في القنوت بالفرائض على النوازل فقط[2].

ئەمە ڕای (الشيخ العثيمين) و زانایانی (اللجنة)یە لەسەر چـــاولـــێکردن (متابـعة)ی إمام لـەو قـنوتەی لـە بەیانیان دا بەبێ بەڵگە

---

(١) مجموع فتاوى ورسائل العثيمين (١٤/ ١٧٨).

(٢) فتاوى اللجنة الدائمة (٧/ ٤٥).

دەخوێنرێت.

بەدەر لەوەی كە دەبێت مامۆستایان و شارەزایان هەوڵی بنەبڕ كردنی ئەم هەڵەیە بدەن تا نوێژەكەیان بگێڕنەوە سەر ئەو شێوازە نوێژەی پێغەمبەری خواو هاوەڵان كردوویانە، وەكو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: «صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي»[1].

**واتە:** وا نوێژ بكەن وەك چۆن دەبینن من نوێژ دەكەم.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ لاَ إِلَهَ إِلاَ أَنْتَ اسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

(١) رواه البخاري، وأحمد. وهو مخرج في " إرواء الغليل " تحت الحديث (٢١٣) .

# ناوەڕۆک